مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلّا اللهُ،
مُخْلِصًا، دَخَلَ الْجَنّةَ

هەر كەس لە ناخەوە بڵێ:
(لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشتەوە

يَا مُقَلّبَ الْقُلُوبِ ثَبّتْ
قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ

ئەی هەڵگێڕەوەی دڵان!
دڵمان لەسەر دینەكەت بچەسپێنە

اعْلَمُوا أَنّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمْ الصّلَاةُ

باش بزانن، باشترینی
كردەوەكانتان نوێژ كردنە.

الْمَسْجِدُ بَيْتُ كُلِّ مُؤْمِنٍ

مزگەوت ماڵی هەموو بڕوادارێكە

صَلَاةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ
الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً

نوێژی بەكۆمەڵ27 جار خۆی
زیاترە لە نوێژی بە تەنیا

إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ
رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ

ئەگەر یەكێكتان چووە ناو مزگەوت، با دوو
ڕكات نوێژ بكات، پێش ئەوەی دابنیشێ.

**الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ**

باوک دەرگای نێوەڕاستی بەهەشتە

**لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ عَاقٌّ**

ئەو کەسەی خراپ بێ لەگەڵ دایک و باوکی، ناچێتە بەهەشتەوە.

**تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ**

بە زەردەخەنە کردنت بۆ برا و هاوەڵەکەت، خێر و چاکەت بۆ دەنوسرێ.

**لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا**

لە ئێمە نییە ئەوەی بە بەزەیی نەبێ بۆ بچووکەکانمان و ڕێز نەگرێ لە گەورەکانمان.

**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ**

یەکێک لە ئێوە بە بڕواداری (تەواو) دانانرێ تا چی بۆ خۆی پێخۆشە، بۆ برای مسوڵمانی خۆی پێی خۆش نەبێ.

**اِقْرَؤُوا القُرْآنَ وَاعْمَلُوا بِهِ**

قورئان بخوێنن و، کاری پێبکەن

لَا يَمَسّ الْقُرْآنَ إِلّا طَاهِرٌ

جگه له کەسی پاک نابێ
کەس دەست نەدات له قورِئان

خَيْرُ الأَصْحَاب عِنْدَ اللهِ
خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ

باشترین برادەر له لای خوا، ئەو برادەرەیه
که زۆر باشبێ بۆ برادەرەکەی

قُلْ السّلامُ عَلَيْكُم، أَأَدْخُل؟

بلّێ: (السّلامُ عَلَيْكُم) ئایا
بێمه ژوورەوە؟

إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلَاثًا
فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فَلْيَرْجِعْ

ئەگەر یەکێکتان سێ جار داوای
مۆڵەتی کرد وەڵام نەدرایەوە،
با بگەڕێتەوە.

أَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِناً

لەگەڵ دراوسێکەت چاکەکار به،
دەبیت به بڕوادارێک (ی تەواو).

مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ
الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ

هەر کەس بڕوای به خوا و به
ڕۆژی دوایی هەیه، با ڕێزی
میوانەکەی بگرێت.

أَمْطِ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ

ئەزیەت و ئازار (و شتی زیان بەخش)
لە ڕێگای خەڵک لابەرە

اقْرَؤُوا الْمُعَوِّذَاتِ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ

سووڕەتی: ئیخلاص و فەلەق و ناس
بخوێنن، دوای هەموو نوێژێک.

ﷺ

الْبَخِيلُ مَنْ ذُكِرْتُ
عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ

ڕەزیل ئەو کەسەیە ناوی
منی لەلا دەهێنرێ و
صەڵاواتم لەسەر نادات

التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ
كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ

کەسی تەوبەکار لە گوناه،
وەک کەسێک وایە گوناهی نەبێت

أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ الصَّلَاةُ
لِوَقْتِهَا، وَبِرُّ الْوَالِدَيْنِ

گەورەترین کردەوە نوێژ کردنە لە
کاتی خۆی، پاشان چاکبوونە
لەگەڵ دایک و باوک.

أُمَّكَ، أُمَّكَ، أُمَّكَ، ثُمَّ أَبَاكَ،
ثُمَّ الْأَقْرَبَ، فَالْأَقْرَبَ

باش بە لەگەڵ: دایکت، دایکت،
دایکت، پاشان باوکت، دوایی
کەسانی نزیکتر و نزیکتر.

كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا

دایکی بڕواداران عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرت و پاداشتی خاوەنەکەشی دەدایەوە.

أَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَلَا تَرُدُّوا الْهَدِيَّةَ

وەڵامی کەسێک بدەنەوە کە دەعوەتتان دەکات، دیاری و خەڵات ڕەت مەکەنەوە.

اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَرِزْقًا طَيِّبًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا

خوایە داوای زانستێکی بە سوود و ڕزقێکی حەڵاڵ و، کردەوەیەکی وەرگیراوت لێ دەکەم.

مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللهِ

هەر کەس نوێژی بەیانی بکات لە ژێر پارێزراوی خوادایە

اللَّهُمَّ أَحْسَنْتَ خَلْقِي، فَأَحْسِنْ خُلُقِي

خوایە وەک چۆن وا جوان دروستت کردووم، ڕەوشتیشم جوان بکە.

إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ

بەڕاستی خوا جوانە و جوانی خۆشدەوێ.

اللّهُمّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي،
وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي

خوایە لێم خۆشبە، ڕەحمم پێ بکە،
لەش ساغم بکە، ڕزقم پێ ببەخشە.

إِذَا كَانَ لِأَحَدِكُمْ شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ

ئەگەر یەکێکتان پرچی هەبوو،
با جوان خزمەتی بکات و ڕێزی بگرێ

سَلُوا اللهَ
الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ

داوای لێخۆشبوون و
لەش ساغی و سەلامەتی
لە خوا بکەن.

إِذَا لَبِسْتُمْ، وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ،
فَابْدَؤُوا بِمَيَامِنِكُمْ

ئەگەر پۆشاکتان پۆشی،
یان دەستنوێژتان شۆرد،
بە لای ڕاستە دەست پێبکەن.

إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ:
الْحَمْدُ لِلَّهِ

ئەگەر یەکێکتان پژمی با بڵێ:
(الحمدالله) واتە: ستایش بۆ خوا.

اللّهُمّ إِنّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ
الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ

خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە
(زیانی) جنۆکەی نێر و مێ.

كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ

ئەوەندە بەسە کە مرۆڤی پێ بە درۆزن دابنرێ، کە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە.

إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ

ئەگەر سێ کەس بوون، با دووانیان جیا لەوەی دیکە بە چپەچپ (قسە) نەکەن.

لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا

دروست نییە و نابێ مسوڵمان مسوڵمانێکی دیکە بترسێنێ.

مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي

هەر کەس فێڵ بکات لە ئێمە نییە

إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ

ئەگەر یەکێکتان گەیشتە براکەی (خوشکەکەی)، با سڵاوی لێ بکات.

لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ

بێگومان حەڵاڵ نییە بۆ هیچ مسوڵمانێک سێ شەو زیاتر قسە داببڕێ لەگەڵ براکەیدا.

إِنّ الْحَيَاءَ مِنَ الْإِيمَانِ

بێگومان حەیاو شەرم
لە ئیمانەوەیە

إِنـّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنْ
عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ

خوا تەنیا بەزەیی دەنوێنێ بۆ ئەو
کەسانەی بەزەیی دەنوێنن بۆ بەرانبەر

إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ
فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى

ئەگەر یەکێکتان پێڵاوی کردە پێی،
با بە ڕاستە دەست پێبکات.

لَا إِيمَانَ لِمَنْ لَا أَمَانَةَ لَهُ

بڕوای (تەواو) نییە، ئەو
کەسەی سپاردە ناپارێزێ.

الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ
مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ

مسوڵمان ئەو کەسەیە مسوڵمانان
لە زمان و دەستی پارێزراوبن

السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ
لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرّبِّ

سیواک ئامێری پاککردنەوەی
دەمە و مایەی ڕەزامەندی خوایە

أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ
التّامّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ

پەنا بە وشە تەواوەکانی خوا دەگرم
لە خراپەی ئەوەی دروستی کردووە

اللّهُمّ إِنّي أَعُوذُ بِكَ
مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ

خوایە من پەنات پێ دەگرم لە
بێ توانایی و تەنبەڵی
و ترسنۆکی و ڕەزیلی.

بِاسْمِكَ اللّهُمّ
أَمُوتُ وَأَحْيَا

خوایە بە ناوی تۆوە
دەمرم و دەژیێم.

الرُّؤْيَا الصّالِحَةُ مِنَ اللهِ،
وَالْحُلْمُ مِنَ الشّيْطَانِ

خەونی چاک لە خواوەیە،
خەونی ناخۆش و بێزارکەر
لە شەیتانەوەیە

إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ
فَلْيَرُدّهُ مَا اسْتَطَاعَ

ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات با
ئەوەندەی دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە

الْحَمْدُ للهِّ الّذِي أَحْيَانَا
بَعْدَمَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ

ستایش بۆ ئەو خوایەی زیندووی
کردینەوە دوای ئەوەی مراندمانی،
گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە.

مَا عَابَ النَّبِيُّ ﷺ طَعَاماً

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەڵێ:
پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕەخنە و گلەیی لە خواردن نەکردوە.

لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ
مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ

ناچێتە بەهەشتەوە، ئەو کەسەی دراوسێیەکەی لە خراپەو ئەزیەتی پارێزراو نەبێ.

طَعَامُ الْوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ

خواردنی یەک کەس بەشی دووان دەکات.

سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بيَمِينِكَ،
وَكُلْ ممّا يَلِيكَ

ناوی خوا بێنە، بە دەستی ڕاست بخۆ، وە لە پێش خۆتەوە بخۆ.

إنَّ اللهَ يَرفَعُ بِهَذَا الكتَابِ
أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ

خوا کۆمەڵێک کەس بەرز دەکاتەوە بەم قورئانە و هەندێکیشی پێ نزم دەکاتەوە.

اللّهُمّ بَارِكْ لَهُمْ فيمَا رَزَقْتَهُمْ،
وَاغْفِرْ لَهُمْ، وَارْحَمْهُمْ

خوایە بەرەکەت بخە ئەوەی پێت داون، لێیان خۆشبە و بەزەییت پێیاندا بێتەوە.

